بسم الله الرحمن الرحيم

# العذر بالجهل

" خوێنەری بەرێز ئەم بابەتە پەیوەندی بەوەوە هەیە کە کەسێک کوفرێک یان شیرکێک یان گومراییێک دەکات ئایە لە چ کات و ساتێک یان لە چ حاڵەتێکدا بەگشتی ئێمە حوکمی بەسەردا ئەییین، بۆیە ئەم نامیلکەیە باس لەوە دەکات کە جەهل کەینێ وەردەگیرێ و خاوەنەکەی هیچ حوکمێکی نابێت، یان کەینێ جەهلەکە وەرناگیرێ و خاوەنەکەی حوکمی بەسەرا ئەدرێت.

★سەرەتا دەبێت بزانین کە خەڵکی لە بابەتی (عذر بالجهل) بوونەتە سێ بەشەوە:

*① جەهل بە موطڵەقی لە هەموو مەسەلەییێکا و بۆ هەموو کەسێک و بۆ هەموو سەردەمێک کە ئەمانەش مورجیئەکانن کە وا دەڵێن.

واتا: هەر کەسێک، لە هەر بابەتێکی دینا بێت، لە هەر زەمەنێکا بێت، لەناو هەر قەومێکا بێت، کوفر بکات

هەردەڵێت نەزانە.
ـ کە ئەمە جەهلی کردوە بە عوزر و شەرطێک لە مەوانیعەکانی تکفیر، کە ئەمە زۆر هەڵەیە، چونکە بەم شێوەیە کەسانێک ئەخەیتە ناو دینەوە لە کافران.
ـ تەنانەت ئەگەر بەم شێوەیە بێت ئەوا ئەتوانی بڵێیت قارون و هامان جەهل یان هەبوو کە دوای فیرعەون کەوتن لەگەڵ جوندیەکانی، کە لێرەشدا ئەوانی رزگاردەکەی لە ئاگری دۆزەخ، کە ئەمەش پێچەوانەی قسەی الله تعالی یە کە ئەمان اهلی ئاگرن

کە ئەفەرمووێت :
( فَالْتَقَطَهُ آلُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا ۗ إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا خَاطِئِينَ ) القَصَص :٨

ـ جا ئەم کەسانە کە بەم شێوەیەن ئەوا کەسانێکن کە ئەوکەسانەی الله تعالی و پێغەمبەرەکەی (صل الله علیه وسلم) بە کافری داناون ئەمان بە موسڵمانی دە ئەنێن.

*② ئەم بەشەی خەڵکی دەڵێن جەهل بە مطلقی بونی نییە لە هیچ مەسەلەیێکی دینی نە لە مەسائلا نە لە ئەشخاص نە لە زەمەنا.

ـ واتا: کەس بۆی نییە بەهیچ مەسەلەیێکی دین جاهیل بێت، و بەهەر مەسلەیێک جاهیل بێت ئەوا پێی کافر ئەبێت، نەگوێ بە زەمەن وحاڵی کەسەکە ئەدەن یەکسەر کافری ئەکەن، ئەمانیش خەواریجکانن.

ـ کە ئەم خەواریجانە دێن ئەوەی خوای گەورە بە موسڵمانی داناوە بە کافری دا ئەنێن وە ئەوەی الله تعالی عوزری داوەتێ ئەمان لێی ئەسەنن و تەکفیری ئەکەن. (پەنا بە الله تعالی لە هەردوو گروپەکە کە)

*③گروپی سێیەم کە اهلی سوننە و جەماعەتن کە لەم بەینەیا وەصەتن، ئەوەی خوای پەروەردگار عوزری پێ دابێ پێی ئەدەن و کافری ناکەن و ئەوەی خوای گەورە عوزری پێی نەدابێ پێی نادەن و کافری ئەکەن.

***********************************

ـ کەلیمەی (الجهل) دژی کەلیمەی (العلم)ە.
ـ الجهل: عدم معرفة الحق.
واتا: نەبوونی زانیاری دەربارەی حەقەوە.
«کەئەمە خۆی لە ئەصلا جەهلی (بسیط)ە»

★جەهل دەبێتە سێ جۆر :

①جەهل بە نیسبەت کەسەکەوە.

②جەهل بەنیسبەت با بەتەکەوە.

③جەهل بە نیسبەت زەمانەکەوە.

★جەهل بە نیسبەت کەسەکەوە دەبێتە دوو جۆر:

① جهلی (بسیط): عدم الادراک شیئ مطلق.

واتا: شتەکە نازانێ بە موطلەقی.

②جهلی (مرکب): إدراک شیئ خلافا لما علیە.

واتا: شتێک نازانی کە حەقیقەتی بابەتەکەیە بەڵام شتێکی تر دەزانی کە حەقیقەتی بابەتەکە نییە و تێی ئەوە ئەکەیە ئەصل لە لای خۆت.

* جەهلی (بسیط) ئەم جەهلە حیسابی بۆ ئەکەین بەڵام بە پێی سەردەمەکە و کەسەکە و بابەتەکە.

*جەهلی (مرکب) هیچ حیسابێکی بۆ ناکەین لە هیچ کاتێکدا کە ئەمەش پیسترین جۆری جەهلە، کە کەسەکە شتەکە بە هەڵە ئەزانێت و ئامادە نییە ڕاستییەکە وەر بگرێ ئەڵێ ئەوەی خۆم ڕاستە.

بۆ نموونە کەسێک نازانێ تەوحید چییە؟ شیرکی لێ بووەتە تەوحید و ئەڵێ ئەو شیرکە تەوحیدە، کە تۆ بە ئایەت و فەرموودە دەڵێی ئەمەی تۆ شیرکە بەڵام هەر ناگەرێتەوە.

*کە بەداخەوە ئەم جەهلە توشی موسڵمانانی ئەمرۆ بووە کە هیچ نازانێ لە دینەکەی و ئەڵێ بەقەد سەد مەلا ئەزانم، نەخێر بەڵکوو بە قەد سەد ابوجهل جاهلە، بەقەد سەد ابو لهب جاهلە.
جابەراستی ئەم جەهلە (مرکب)زۆر خەتەرە چونکە وات لێ ئەکات کە بۆ (علم) نەرۆی و ئەوەی خۆت لەسەری کە باطلە بە عیلمی بزانی.
ـ و خاوەنی جەهلی (بسیط) خۆی بە نەزان دا دەنێت وە ئەتوانی فێری بکەیت، بەڵام جەهلی (مرکب) خۆی بەزانا دا ئەنێ لە کاتێکا نەزانە و (علم) وەرناگرێت.
*بۆیە جەهلی(مرکب) تکفیر دەکرێتن، بەڵام جەهلی(بسیط) بۆی روون دەکرێتەوە لە هەندێ بابەت و لەهەندێ حاڵەت و لە هەندێ سەردەمدا.

*جهلی (بسیط) پەیوەندی بە شەخسەکەوە هەیە لەدوو رووەوە:

① شەخسەکە خۆی وازی لە فێربوونی عیلم و تەوحید

و ناسینی شیرک و کوفر هێناوە و بەدوایاندا نەچووە لە بەر دونیا، ئەمەیان تاوانبارە چونکە خۆی وازی لە فێربوونی عیلم هێناوە بۆیە جەهلەکەی ێ وەرناگیرێ چونکە ئەی توانی فێری ببێت بەڵام نەچووە، ئەمە تەکفیر ئەکرێت.

②ئەمەیان هەوڵی داوە فێری بێت بەڵام هەر ئەوەندە فێربووە، هەوڵی داوە گوێی گرتووە بەڵام ئیتر عەقلی توانای تێگەیشتن و لێکدانەوەی با بەتەکانی بە وردی نەبووە، دوای هەوڵدانێکی زۆر جاری واهەیە کەسی دەست نەکەوتووە یان تازە موسڵمان بووە ئەمە جەهلەکەی حیسابی بۆ دەکرێت و تەکفیر ناکرێت.

'ئەمە بە نیسبەت ئینسانەکانەوە'

★بەنیسبەت بابەتەکانەوە کە جاهلی پێیان دوو جۆرن:

①مسائل ظاهر: بابەتی روون و ئاشکرایە لە دینەکەماندا، کە هەموو کەسێک ئەتوانێ فێری ببێت، کە ئەمەش بریتییە لە (لا اله الا الله محمد رسول الله) ئەمە روون کە (لا اله الا الله) کە دەبێت بەس خوا بپەرستی، ئەمە بۆ هیچ کەسێک نییە کە پێی جاهیل بێت چونکە کە نەزانێک پەرستنی خوای گەورە بە

حەق و ڕەتکردنەوەی خوا وەندە درۆینەکانە ئیتر ناتوانێت بێتە ناو ئیسلام، چونکە دەبێت ئەمە بزانێت وە بریاری جێ بەجێکردنی بدات ئینجا تێتە ناو ئیسلام.
و (محمد رسول الله) کە پێشەوام محمد(صل الله علیه وسلم) لە پەرستنی خوای گەورە و ڕەتکردنەوەی خوا بەتاڵەکان.
بۆیە کە ئەم حەقیقەتەی زانی بۆی نییە ئەم شایەتوومانەی خۆی هەڵبوەشێنێتەوە و بڵێ نەزان بووم، بچێ خوایەکی دیکە بپەرستێت و بڵێ نەمزانی، بابە تۆ عەهد و پەیمانت بەخوا داوە کا بەس ئەو بپەرستی یانی چی ئیستا دەرۆی خوایەکی تر دەپەرستی.
کە تۆ عەهد و پەیمانت داوە بەس محمد (صل الله علیه وسلم) بکەیە پێشەوای خۆت چییە ئێستا دەرۆی کافرێک ئەکەیە پێشەوای خۆت.
بۆیە جەهل لە مەسەلەی شایەتوومان کە بنچینەی دینە ناخوات، و تەکفیر ئەکرێیت.

② مسائل خفيَّ: کۆمەڵێک بابەت کە بەس زانایان ئەزانن کە کوفرە و هەموو کەسێک نازانێت، لەم بابەتانەیا نەزانی و جەهل ئەخوات بۆ کەسی نەزان، ئەبێت زانایان بێن بۆیان ڕوون بکەنەوە.
بۆیە ئەوکەسانەی کە کافر بوونە لە بابەتە وردەکان کە

بەس زانایان دەی زانن ئەوا تەنیا زانایان ئەتوانن کەسەکە کافر بکاتن، بەڵام ئەگەر لە بابەتە بنچینەییەکە و شایەتووماندا کەسەکە کافر بوویێت ئەوا لەسەر هەموو کەسێکە کە کافری بکات.
«کە ئەمە عەقیدەی زانایانی ئەهلی سوننەیە»

★با بزنین ماسائل (جليّ)ن کە روون و ئاشکران چین:

کە لەم مەسائل ەدا جەهل ناخوات.
ـ وەکو بابەتەی (لا اله الا الله محمد رسول الله) کە ئەمە کەس بۆی نییە جاهیل بێت پێی.
ـ وەکو ئەو بابەتانەی کە لە دینا پێویستە بیزانی(نموونە: نوێژ،زینا،دزی،کوشتن...هتد).
ـ وەکو ئەو بابەتانەی کە زانایان ئیجماعن لەسەری و رۆن کراوەتەوە لە پەرتووکی زانایاندا.
ـ وەکو ئەو بابەتانەی کە هەموو کەسێک ئەتوانێ زانابێت تیایا و ئەتوانێ پرسیار بکات و خۆی فێر بکات، بۆیە جەهل لە بابەتە (جليّ)ەکاندا وەرناگیرێت.

بەڵام لە مسائل خفيّ وەکو غەیری(نوێژ،رۆژوو، زکات،حەج،تەوحید...هتد) کە لەمانە ورتترە و ئەو بابەتانەی کە بەڵگەکانی خەفییە کە هەمووکەسێک

نایزانێت جگە لە زانایان بۆیە شوبهە و تەئویل و تەفسیری تیایا بوونی هەیە، ئەمە جەهل تیا وەردەگیرێ.
یان کەسێک کە ناتوانێ فێری بابەتەکە بێت، جا کاس نییە فێری بکات یان تازە موسڵمان بووە، ئەمەش جەهل تیا وەردەگیرێت.

★بەنیسبەت زەمانەوە کە ئەمەش دەبێت بەدوو بەشەوە:

① زەمەنێک کە زانایان بوونیان نامێنێت کە خەڵکەکە دەبێتە (اهلی فطر)ە تارادەییێک بۆ ئەوەی سزا نەدرێت نەک تەکفیر نەکرێت.

② زەمەنێک کە زانایان بوونیان هەبێت کە ئەمە جەهل وەرناگیرێت.

*********************************

★ئێستا با بزانین کە زانایان لە بابەتی جەهلی روون(جليَّ) و ناروون(خفيَّ) چییان وتووە:

ـ ئیمامی ئەبو حەنیفە وەکو چۆن معلي قارئ لە شرحی فقە الاکبر لێوەی نەقل ئەکات لە قاضی یوسفەوە ئەفارمووێت:

(لا عذر لأحد في جهله معرفة خالقه لأن الواجب على الجميع معرفة رب، وتوحيده لما يرى من خلق سماوات والارض وسائري ما خلق الله، و امالفرائض فمن لم يعلمها ولم تبلغه فان هذا لم تقم عليه الحجة)

واتا: (ئیمامی ئەبو حەنیفە فەرموویەتی: بیانو(عوزر) بۆ هیچ کەسێک نییە لە ناسینی خوای پەروەردگارا، چونکە واجبە هەموو کەسێک خوای پەروەردگار بناسێت، وە پەرستنی خوای گەورە بە تەنها لەبەر ئەوەی زەوی و ئاسمان ئەو دروستی کردووە وە ئەوەی کە لەناویەتی، بەڵام هەندێ لە فەرزەکان هەن ئەگەر کاسانێک نەیزانێت ئەوا بیانو (عوزر) بۆی هەیە).

وەکو : خەتەنەی پیاوان یان ریش تاشین یان برینی نینۆک..هتد) کە ئەگەر کەسێک نەیزانێ فەرزە ئەوا عوزری بۆ هەیە.

ـ ئیمای ابن تیمیة لە شرحی عمد یا ئەفەرمووێت:

( فكل من رد خبر الله او امره كفر، دق او جل، لاكن قد يخفى عما خفيت فيه طريق العلم و كانت امرا يسيرا من الفروع)

واتا : (ئیمامی ئیبن تەیمییە ئەفەرمووێت: هەر کەسێک بابەتێکی خوای پەروەردگار رەت بکاتەوە بچوک بێت

یان گەورە بێت پێی کافر ئەبێت، بەڵام هەندێ بابەتمان هەیە کە ئاشکرا نییە بۆ خەڵکی کە بابەتەکە لە فروع(لق) بێت کە ئەمە خەڵکی لەسەر کافر ناکرێت.)
بۆ نموونە: ئەگەر کەسێک بڵێت باورم با فریشتە نییە ئاوا کافرە، وە ئەگەر بڵێت باورم بە دوو فریشتەکەی سەرشان نییە ئاوا هەر کافرە.
یان بڵێت باورم بە نوێژ نییە ئەوا کافرە، وە بڵێت باورم بە دەموو چاو شوشتن نییە لە دەست نوێژ ئاوا هەر کافر ئەبێتن.
بۆیە بابەتەکە گەورەبێت یان بچوک بێت مادام فەرمانی خوای لە سەرە ئەواکافر ئەبی ئەگەر باوری پێ نەهێنی.

ـ ایمامي ابن تیمیة ئەفەرمووێت:

(و هذا ان كان في المقالات خفية فقد يقالو انه مخطئ ضال لم تكن عليه الحجة لتى يكفر صاحبها، لكن من ذلك طوائفة منهم في الامور ظواهر لتي تعلم عامة والخاصة انها من دين المسلين بليل يهود ونصارا يعلمون ان محمدا بعث بها و كفر مخالفيها مثل امره بعبادة الله وحده لا شريك له و نهي عن عبادة ما سوى الله و مثل صلواة الخمس و شعائر الاسلام و معاداته لليهود و نصارا وصابئين و المشركين و المجوس و

مثل تحريم فواحش و ربيا والخمر والميسير و نحو ذلك ثم نجد كثرا من رئسائهم و قع في ذلك فكان مرتدين ) مجمع الفتاوى، مجلد 4، صفحة54.

واتا: ئەگەر کەسێک ئشتهاد بکات یان ڕەئییێکی هەبێت لە بابەتە خەفیە کانا( ئەو بابەتانەی کا ئاشکرا نین) ئەوا ئەگەر هەڵە بکات دەڵێین هەڵەیێکی کردووە یان گومراییێکی کردووە، پێی ناڵێین کافر بووە، هەتا وەکو (عقام الحجة) ی لەسەر ئەکەین(واتا بابەتەکەی بۆ ڕوون ئەکینەوە) ئەگەر ئینکاری کرد ئەوکات پێی ئەڵێین کافر، بەڵام هەندێ بەبەتی تر هەیە کە لە بابەتە ڕوون و ئاشکراکانە کە هەموو کەسێک ئەی زانێت لە (عام) و (خاص) واتا خەڵک بەگشتی و زانایان دەزانن، نەک هەرئەوانیش بەڵکو یەهود و مەسیحی دەزانن کە ئەوە دینی موسڵمانانە(وەکو: نوێژ ڕۆژی بەریبوون لەمشریکەکان و زەکات و حەج پەرستنی خوا....هتد) کە ئەمانەی یەهوودیش دەزانن کە لە شەعائیری ئیسلامن وەکو حەرامیەتی مەشروب و زینا و ڕیبا خواردن و دزی کردن و کوشتن ...هتد) کە ئەمانە هەموو کافرێکیش ئەزانێت کە موسڵمان دژی ئەمانەیە، بۆیە زۆرێک لە ڕئوسەکانیان (گەورەکانیان) کە ئەمانەش دەزانن بەڵام دەچن پێچەوانەکەی ئەکەن ئەمانە هەمووی پێی کافر ئەبن و هیچ عوزرێکی بۆ

ناهێنێتەوە ( تەبعەن کە حەڵاڵیان کرد).

ـ ئیمامی قەڕافي ئەفەرموویێت:
( واعلم ان الجهل نوعان نوع الاول :جهل تسامح الشرع عنه فعفا عن مرتكبه و ضابته كل ما يعتزر الاحتراز منه عادة فه معفو عنه، والثاني: جهل لم يتسامح صاحب شرع عنه فلم يعف عن مرتكبه و ضابته كل ما يعتزر الاحتزار و لا يشق و لا يعف عنه، يطرد في اصول الدين و اصول الفقه و بعض انواع الفروع)

واتا: بزانە ک جەهل(نەزانین) دوو جۆرە جۆری یەکەمی: شەرع لێخۆشبوونی بۆی هەیە لە بەرامبەرا ئەو جەهلەیەکە خاوەنەکەی لە توانایدا نییە فێری ببێت، دووەم: ئەوجەهلەیە کە هەموو کەسێک ئەتوانێ فێری ببێت بۆیە خاوەنی شەرعەکە(کە الله یە) ئەتوانێ سزای بات لەسەری، لەبەر ئەوەی ئەمە ئیتر داخڵی بناماکانی دین ئەبێت داخڵی بنەماکانی فقە و هەندێک لە لقەکانی (بۆیە جەهلی دووەم عوزری بۆ نییە).

*********************************

★ئێستا با بزانین قورئانی پیرۆز ی دەربارەی ئەم بابەتەیا چی وتووە:

تەبعەن قورئانی پیرۆز هەرگیز ڕێی نەیاوە تۆ کوفر بکەیت و بڵێی دڵم باشە، ئەمە تەنیا مونافیقەکان وانە، کە کوفر ئەکەن و ئەڵێن دڵمان باشە.

ـ یەکێ لەو ئایەتانە کە مونافیقان گاڵتەیان بە موسڵمانان کرد وتیان سەیری ئەو وسڵمانە ورگ زلانە بکە، کە ئەمانە خۆیان بە قورئان زان دا دەنێن، سەیریان کە چەند ورگیان زل و ناشرینە.
بەم شێوازە گاڵتەیان ئەکرد لەسەر ئەمە ئایەت دابەزی و کافریانی کرد، پاشان هاتن بۆ لای پێغەمبەر(صل الله عليه وسلم) وتیان: نەمانزانی و مەبەستمانیش کوفر نەبووە، وتیان دڵ حسابە ئێمە لەدڵەوە کوفرمان نەکرد بەڵام رسول الله (صل الله عليه وسلم) پێیانی فەرموو :
( لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ۚ ...) التوبَة : ٦٦
بڵێ: هیچ بیانوێک مەهێننەرەوە، چونکە پاش ئەوە باوەڕتان هێنا، کافربوونەوە.
بۆیە لێرادا رسول الله (صل الله عليه وسلم) هیچ گرنگی با دڵیانی نەدا و وانی کافر کرد.

ـ وە هەروەها لە ئایەتێکی ترا الله تعالی ئەفەرمووێت
( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ) الحُجُرات : ٢
ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! هەرکات لەگەڵ پەیامبەردا -صلی الله علیه وسلم- گفتوگۆتان کرد، دەنگتان بەسەر دەنگیدا بەرز مەکەنەوە، بە چ و قسەی بەرزو بێ پەردە مەکەن لە ڕوویدا، وەک چۆن لەگەڵ یەکترییدا بە دەنگی بەرزو، ڕووبەڕوو قسە دەکەن و دەنگ بەرز دەکەنەوە، نەوەک بەو هۆیەوە کردەوەکانتان بەتاڵ و پووچەڵ ببنەوە و بەخۆیشتان نەزانن.

کە ئەمە کوفری زۆری خەڵکی ئێستایە لە رەت کردنەوەی فەرموودە و ئایەت کە قسەی خۆی بە باشتر ئەزانێت لە سەریان، کە ئەمانە خۆیان کافر بوونە و ئاگاشیان لە خۆیان نییە، بۆیە الله تعالی ئەوانی کافر کرد و گوێی بە دڵیان نەدا

ـ وە هەروەها الله تعالی ئەفەرمووێت:
( فَرِيقًا هَدَىٰ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ الضَّلَالَةُ ۗ إِنَّهُمُ اتَّخَذُوا

الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ اللَّهِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ) الأعرَاف : ٣٠

دەستەیەكیانی ڕێنماییكرد بۆ رێگای راست و دروست و بەرێی چاكدا چوون و دەستەیەكیشیان بەهۆی كاروكرداری خۆیانەوە گومڕابوونیان لەسەر چەسپا چونكە ئەوان لە باتی خوا شەیتانیان كردە یاریدەرو دۆستی خۆیان و وایشیان دەزانی لەسەر رێی هەقن و رێنمان.

لێرەدا الله تعالی ئەو كەسانەی كافر كرد كە چون دۆستایەتی شەیتانیان كرد لە كاتێكا كە وایان دەزانی ئەمە رێگای حەقە، بۆیە لێرەشدا خوای گەورە گرنگی نەدا بە دڵیان كە چی تیایە بەڵكو گرنگی بە كار و كردەوەیانی دا.
بۆنموونە كە كابرا ئەروات قەبر ئەپەرستێت یان پیاوچاكیان ئەپەرست كە لەكاتێكدا لەلای وان ئەمە پەرستنی خوایە بەڵام نەخێر ئەمە رێی شەیتانە وە كەسەكە پێی گومرا و سەرلێ شێواو ئەبێت.
بۆیە مەبەستەكەی ناودڵیان كە پەرستنی خوایە هیچ سوودێكی بۆیان نەبوو.

ـ له شوێنێکی تردا الله تعالی ئەفەرمووێت :

( قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا ) الكهْف : ١٠٣
بڵێ ئەی محەممەد صلی الله علیه وسلم! ئایا پێتان بڵێم:
زیانبارترین کەس لای خوا کێیە؟

( الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا ) الكهْف : ١٠٤
ئەوانەن کە هەوڵ و تێکۆشانەکانیان لەم ژیانی دونیادا
بەهەوانتەو بێ ناوەرۆک دەرچوو، چونکە بێ
بڕوابوون و هەرچیشیان کردبێ لێیان وەرنەگیراوە.
لەگەڵ ئەوەیشدا لایان وایە کارێکی شیاوو شایستەیان
ئەنجام داوە، خۆیان نەزانکرد کە: ئاکارچاکی لەگەڵ
کوفرو بێ بڕواییدا کەڵکی نابێ.

( أُولَٰئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَلِقَائِهِ فَحَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا ) الكهْف : ١٠٥
ئەوانە کەسانێکن کە بەئایەتەکانی پەروەردگاریان و
بەگەیشتنی دیداری ئەو لە دواڕۆژدا کافرو بێ
باوەڕبوون ئینجا لەبەر ئەوە کردەوەکانیان نابوودو
پووچەڵبووە ئینجا ئێمەش لەڕۆژی قیامەتدا هیچ

تەرازوو میزانێکی سەنگینیان بۆ دانانێین.

لەم ئایەتانەشدا الله تعالی باسی ئەوانەمان بۆ دەکات کە کردەوەی کوفر و گومرایی دەکەن بەڵام دەڵێن دڵمان باشە، وادەزانن کە کردەوەکە و نێزیکیان دەکاتەوە لە الله تعالی، بەڵام الله تعالی لێیان وەر ناگرێت و حیساب بۆ دڵیان ناکاتن و بە گومرای هەژماریان دەکاتن، وە ئەفەرمووێت کافری حەقیقی ئەمانەن کە هەرچی کوفرە ئەی کەن و دەڵێن دڵمان باشە نیەتمان باشە، بەڵام الله تعالی ئەو کردەوانەیان بۆ حیساب ناکاتن.

★وە لە فەرموودەشدا ئەم باسەمان هەیە:
کە رسول الله (صل الله علیه وسلم) ئەفەرمووێت:
کەسانێک هەن وشەیێک دەڵێن کە ئاگای لێی نییە چی دەڵێت و پێی دەرواتە ئاگرەوە.
یان لە ریوایەتێکی ترا ئەفەرمووێت: حەفتا ساڵ رۆ ئەچێ بەناو ئاگرا.

لێرەدا کەسەکە ئاگای لە خۆنییە دەڵێت دڵم باش بوو بەڵام حیساب بۆ دڵی ناکرێ و حەفتا ساڵ ئەچێت بە ئاگرا، بۆیە ئەبێت دڵ و کردەوە و وتەکە هەمووی بۆ

خوابێت.
وه هەركەسێک كوفر و شیركی كرد به لەش ئێمه حیساب بۆ دڵی ناكەین و پێی دەڵێین كافره.

* * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * * *

تكایه خوێنەری بەرێز لەدوعای خێر بێبەشمان مەكه.

و الحمدلله رب العالمین.